# مسائل الإمام
# أحمد بن حنبل
## بە کوردی

گێڕانەوەی : باوکی قاسم البغوي
ناسراوە بە : إبن بنت منيع رحمه الله
( ٢١٤هـ - ٣١٧هـ )

وەرگێڕانی : طارق حسن الكردي

# مسائل الإمام

# أحمد بن حنبل

## بە کوردی

گێڕانەوەی : باوکی قاسم البغوي

ناسراوە بە : ابن بنت منيع رحمه الله

٢١٤ هـ - ٣١٧ هـ


وەرگێڕانی

طارق الكردي

# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي استوى على عرشه بائن من خلقه بحده، و صلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.

أما بعد :

گومانــی تێدا نیە کە شوێن کەوتنــی کردار و گوفتاری زانایانــی سەلەف کە دەسگرتون بــە قورئان و سوننەت و شوێنکەوتەی ڕاستە قینەی هاوەڵانــی رسول الله ــن ﷺ ، وە چاو لێکردنیان سەرفرازی و سەلامەتی لە دیندا بە دوای خۆیدا دێنێت.

یەکێک لەو گەورە زانایانەش ئیمام و پێشەوای ئەهلی سوننەیە و حدیث ئیمامی أحمد ــە رَحِمَهُ ٱللَّهُ ، کە خاوەنی کۆمەڵێک ڕای جیاوازە لە مەسائلە فیقهــی و فەرعیەکاندا[١] .

بــۆیە پێمان خۆشبوو کۆمەڵێک فەتوا و ووتــەی ئەم ئیمامە بەڕێزە بــۆ ئێوەی ئازیز بخەینە ڕوو ، لەو بابەتانەی فەتــوای تێدا داوە لــە ڕوانــگەی قورئان و سوننەتەوە ، وە یەکێک لــەو زانا بەڕێزانەی کە کۆمەڵێک لە بابەتەکانــی ئیمامــی کۆکردوەتەوە بریتیە لە ئیمامی بغوی ( ابن بنت منیع ) رَحِمَهُ ٱللَّهُ.

بــۆیــە وەرمانگێڕایە ســەر زمــانــی کــوردی تاوەکــو شەیدایان و فێرخوازانــی زانستی شەرعی لێی بەهرەمەند ببن.

داواکارین لە الله بیکاتە مایەی خێر و نیەتمان بۆ زاتی خۆی پاک بکاتەوە.

---

(١) نەك لـە نێوان زانایان هاوەڵان تەنانەت لـە نێـوان موسڵمانانیش ڕای جیاوز نیـە لـە بابەتـە بنچینیەکانـدا کـە بریتیە لـە بابەتـی عـەقیدەیـی.

# پێناسەی نوسەر

* **ناو و نەسەبی** : عبدالله ــی كوڕی محمدی كوڕی عبدالعزیزی كوڕی مرزوبانی كوڕی سابوری كوڕی شاهنشانە ، كونیەكەی باوكی قاسم بغوی یە ، لە بغداد لە دایک بووە[٢] .

* **لە دایك بوونی** : أبوبكری كوڕی شاذان دەڵێت : گوێم لێبوو لە بغوی ( نوسەر ) دەیوت : لەساڵی ٢١٣ لە دایک بووم.
ابن شاهین دەڵێت : گوێم لێبوو دەیوت : ٢١٤ لە دایک بووم.
خطیب البغدادی دەڵێت : ئەوەی ابن شاهین جێگیر ترە.

* **دەستكردنی بە داواكردن بۆ زانستی شەرعی** : ابن شاهین دەڵێت گوێم لێبوو دەیوت : یەكەم جار حەدیسم نوسی ساڵی ٢٢٥ بوو ، لە اسحاقی كوڕی أسماعیلی طالقانی ، لای باپیری خوێندویەتی بە منداڵی .

* **مامۆستاكانی** : ئیمامی أحمد ، علی كوڕی مدینی ، علی كوڕی جعد ، أبی نصر التمار ، هدبة بن خالد ، بشر بن الولید الكندي ، أبي ربیع الزهراني ، ابن عمر القواریري ، ابن عبد الله الزبیري ، وە زۆرێكی دیكە.

* **قوتابیەكانی** : یحي بن صاعد ، ابن قانع ، أبو علي نیسابوري ، أبو حاتم ابن حبان ، أبو بكر الإسماعیلي ، ابن عدي ، أبوبكر الشافعي ، دعلج السجزي ، طبراني ، أبو أحمد الحاكم ، الدار قطني ، ابن شاذان ، ابن شاهین ، وە زۆرێكی دیكە.

---

(٢) ( الكامل لابن عدي – ٤/١٥٨٧ ) ، ( تاریخ بغداد – ١٠/١١١ ) ، ( سیر أعلام النبلاء – ٤/٤٤٠ ) ، ( شذرات الذهب لابن عماد الحنبلي – ٢/٢٧٥ ).

❋ **پیاهەڵدانی ئەهلی علم بۆ ئیمام** : أردبیلی دەڵێت : پرسیار کرا له ابن أبي حاتم دەربارەی ئیمامی أبـی القاسم البغوی ، ئایا دەچێته صحیح وە؟

فەرمـووی : بەڵـێ ( واتـه حەدیسـی لـێ وەردەگیرێـت و بەجێـی سیقه دادەنرێت له حەدیسدا ).

الدارقطني دەڵێت : أبو قاسمی کوڕی منیع کەم قسەی له حەدیس کردوە، کاتێکیش قسەی تێداکردبێت وەک داکوتینی بزمار وابوە بە ساجێکدا.

( واته جێگای متمانه بوە له حەدیسدا ).

أبو عبدالرحمنی سولەمی دەڵێت : پرسیارم کرد له الدارقطنی دەربارەی بغوی ، ووتی : کێوێکه له متمانەدا ، پێشەوایەکه له پێشەواکان ، وتەی ئەو له حەدیسدا باشتره له وتەی ابن صاعد .

خطیب البغدادی دەڵێت : متمانه پێکراوە و تێگەیشتنێکی باشی هەیه و زانا و بە ئاگایه.

❋ **وەفاتی** : إسماعیل بن علی الخطبی دەڵێت : أبو قاسمی بغوی وراق وەفاتی کرد له شەوی جەژن له ساڵی ٣١٧ ــی هیجری، ڕۆژی جەژن به خاک سپێردرا ، تەمەنی ١٠٣ ساڵ و یەک مانگبوو رحمهم الله .



# دەستپێکی کتابەکە

باوکی حسين عبدالحق کوڕی عبدالخالق کوڕی أحمد کوڕی يوسف هەواڵی پێداین ، باوکی حسين مبارک کوڕی عبدالجبار صيرفی هەواڵی پێداین بە ئیجازەوە ، باوکی محمد حسن کوڕی محمد کوڕی حسينی خلال هەواڵی پێداین ، باوکی عمر محمدی کوڕی عباسی کوڕی محمدی کوڕی زکريايی کوڕی حيويەی خزار هەواڵی پێداین.

ووتی : باوکی قاسم عبدالله ـی کوڕی محمدی عبدالعزيزی بغوی هەواڵی پێداین فەرمووی :

**١-** باوکی عبدالله ـم بينی ئيمامی أحمدی کوڕی حنبل رَحِمَهُ ٱللَّهُ کاتێک دەستی بە نوێژ دەکرد دەستی بەرز دەکردەوە تاوەکو نزيک گوێچکەکانی دەبووەوە ، وە کاتێک دەچوە ڕکوع و سەری بەرزەوە دەکرد لە ڕکوع ، وای دەکرد [٣] .

**٢-** گوێم لە ئيمامی أحمد بوو دەی وت : وەليدی کوڕی أبو هشام متمانەيە لە حەديثدا [٤] .

**٣-** بۆيان گێڕامەوە ئيمامی أحمد و باپيرم ووتيان : بۆی گێڕاينەوە ئيسماعيلی کوڕی ئيبراهيم لە وەليدی کوڕی أبی هشام لە أبوبکری کوڕی محمد کوڕی عەمری کوڕی حزم ، لە عەمرەوە ، لە عائيشەوە فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی دەخوێند بە پێوە لە نوێژدا کە دەيويست بچێتە ڕکوع دەوەستا هێندەی خوێندنی چل ئايەت لە قورئان [٥] .

---

(٣) (أخرجه أحمد ٤/ ٣١٦-٣١٧ ) و ( مسلم ٢/١٣ ) و ( أبو داود ٧٢٣-٧٢٥ ) و( ابن خزيمة ٩٠٥-٩٠ ).

(٤) وەليدی کوڕی أبی هشام ، مەدەنی ، برای هشامی أبی مقدام.

(٥) ( إسناده حسن ، رواه مسلم ١/٥٠٥ ).( والنسائي - ٣/٢٢٠)،(وابن ماجه -١٢٢٦).

**٤-** گوێم لێبوو له ئیمامی أحمد دەیوت : أبو مهاجر الرقی که ناوی سالمه ، جێی متمانەیه له حدیث ، وه پیاوێکی چاکەکاره[٦] .

**٥-** ئیمامـی أحمد بۆیگێڕاینەوه ، علـی کـوڕی ثابـت بۆیگێڕاینەوه وتـی : باوکـی موهاجـری رقـی بـۆی گێڕاینـەوه ، لـه مـەیمونـی کـوڕی میهـران کـه وتی: موهاجرین ئەگەر بیان بینیایه پیاوێک به سواری دەڕوات وه پیاوانیش به پێ لەگەڵی بڕۆن دەیان وت : الله بیکوژێت ئەو ستمکاره[٧] .

**٦-** پیاوێک پرسیاری کرد له ئیمامـی أحمـد ، وه مـن گوێـم لێبوو وتـی : چەنێک نوێژ بکەم ڕۆژی جومعه ؟

فەرمـووی : هەرچەند دەتەوێت ، گەر ویستت شەش ڕکات بکه ، وه ئەگەر ویستت چوار ڕکات[٨] .

---

(٦) سالمی کوڕی عبدالله الجزری،باوکی مهاجر له هۆزی بنی کلابه متمانه پێکراوه .

(٧) جێگیر بووه میمونی کورڕی مهران گوێبیست بوه له هەندێك له هاوەڵانی مهاجر لەوانه : ابن عمر و ابن عباس ، أخرجه ابن سعد في الطبقات ١٠/٥٥٦ ، أبو نعيم في حلية الأولياء ٤/٨٦ ، ابن عساكر في تاريخ دمشق ٩/١٤٢.

(٨) ئیمامی أحمد ڕیوایەتی کردووه (٢/٤٩ و ٤٤٣، ٤٤٩) وه (ئیمامی مسلم ٢/٦٠٠) وه (أبو داود ١١٣١) وه (نسائی ٣/١١٣) وه (ترمذی-٥٢٣) وه (ابن ماجه-١١٣٢) وه (دارمی ١/٣٧٠ ) وه جگه لەوانیش.
(بیهقـی لـه الكبرى ٣/٢٣٩ ) له ڕێگای سهیلی کوڕی أبی صالحەوه , له باوکیەوه , له أبی هرەیره ـوه وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : گەر یەکێك له ئێوه نوێژی جومعەی کرد ، له دوایدا چوار ڕکات بکات.
وه لای مسلم هاتوه بەم جۆره : گەر یەکێك له ئێوه نوێژی جومعەی کرد , بەدواید چوار ڕکات بکات.
ئیمامی مسلم هێناویەتی (٢/٦٠١) له زوهریەوه , له سالمی کوڕی عبدالله له باوکیەوه ، له پێغەمبەرەوه ﷺ که له دوای جومعه دوو ڕکاتی کردووه .
نـووی لـەشـەرحـی مسلـم دەڵێـت : لـەم حەدیسانەدا گرنگـی و سوننەت بونـی نوێژی دوای جومعەتان بـۆ دەردەکەوێت , وه کەمترینیان دوو ڕکاته وه تەواوترینیان چواره ( ٦/١٦٩ ).
وه له مسائل هاتوه به ریوایەتی اسحاقی کوڕی هانيء النیسابـوری ، لـه ئیمامـی أحمدەوه(١/٨٩)گوێـم لێبوو فەرمووی : ئەوەی من هەڵیئەبژێرم بۆ ڕۆژی جومعه ، دوو ڕکات له پێشەوه ، وه شەش ڕکات له دوایەوه ، له نێوان هەموو دوو ڕکاتێکیش سەلام دەداتەوه.

٧- پرسیاركرا له ئیمامی أحمد من گوێم لێبوو ، چەند نوێژ بكەم له دوای جومعە؟ چوار یان شەش ، ئایا له هەموو دوو ڕكاتێكدا سەلام بدەمەوە؟
ئیمامی أحمد فەرمووی : من سەلام دانەوەم لا پەسەندە ، ئەگەر سەلامیش نەدەیەوە زیانی نیە.

٨- پرسیاركرا لە ئیمامی أحمد و من گوێبیست بووم ، ئایا بە ڕۆژوو بم لە سەفەردا؟
فەرمووی : نەخێر[٩].

٩- گوێم لێبوو له ئیمامی أحمد دەیفەرموو : ئاژەڵی سائمە ئەو ئاژەڵانەن خۆراكیان پێنادرێت و خۆیان لە بەروبومی زەوی دەخۆن ، پێیان بدرێت زۆر بە كەمی ، وە ئاژەڵی سائبە ئەوانەن وازیان لێهێندراوە و بۆهیچ بەكارناهێنرێت و سوودیان لێ وەرناگیرێ ئاژەڵی سائمە زەكاتی لێدەدرێت.

١٠- پیاوێک وتی بە ئیمامی أحمد وە من گوێم لێبوو : پێم گەیشتوە كە نصاری قورئان دەنوسنەوە ، ئایا ئەوە دەكرێت؟
فەرمووی : بەڵێ ، نصاری قورئان دەنوسن لەبەرئەوەی كەم بوون ئەوانەی دەیان نوسی. (خوێندەوار كەم بووە)
پیاوەكە پێی ووت : ئەمە سەرسامت دەكات؟ ئیمام فەرمووی : نەخێر.

١١- گوێم لێبوو ئیمامی أحمد دەیفەرموو : سوجدە لە واجبدا سونەتە ، واتە : لە نوێژی فەرزدا[١٠].

---

(٩) لەبەر ئەو حەدیسەی كە هاتوە لە جابری كوڕی عبدالله بە مرفوعی : ڕۆژووی سەفەر لە چاكەوە نیە، (أخرجه أحمد ٣/٢٩٩) و (الدارمي ١٧١٦).

(١٠) مەبەستی ئیمام سوجدەی تیلاوەیە لە نوێژدا.

١٢- پرسیارکرا له ئیمامی أحمد منیش گوێبیست بوم : دەربارەی پیاوێک نەزری کردوه مانگێک به ڕۆژووبێت ، ئایا به جیاواز به ڕۆژوو بێت ؟
(پچر پچر و بەسەریەکەوه نه) فەرمووی : نەخێر ئەگەر بیوتایه : سی ڕۆژ ، ئەو کات گەر ویستی بوو به پچڕ پچڕ دەیگرێت.

١٣- پیاوێک پرسیاری کرد له ئیمامی أحمد من گوێم لێ بوو وتی : من له جێگایەکم حەزم پێی نیه ، لەو جێگایەش دایکم لەگەڵە دەمەوێت بڕۆم لەو جێگایه بەڵام دایکم ڕازی نیه پێی خۆش نیه بێت لەگەڵم؟
ئیمام فەرمووی : بۆچی ناتەوێ لەو شوێنه بمێنیت؟
ووتی : جێگایەکه ستەمی تێدا دەکرێت.
ئیمام فەرمووی : گەر وڵاتی ستەم و زوڵمه ، دەرچۆ لەو شوێنه و دایکت جێ بهێڵه ، گەر دایکیشت ڕازی نەبێت.

١٤- پیاوێک پرسیاری کرد له ئیمامی أحمد وتی : من کەسێکی نزیکم هەیه بومەته وەلی ئەو و وەسێتیان کردوه ئاگام له سامانەکەی بێت و لای من دانراوه خۆی دەست بڵاوه و سامانەکەی بەهەدەر ئەدات ، داوای ماڵەکەی دەکات ئایا پێی بدەم؟
فەرمووی : نەخێر پێی مەدە.
پیاوەکه وتی چەندین جار شکایەتی لێم کردوه و منی بردوەته لای والی ، وه ئەو زمان پاراوتره لەمن؟
ئیمام فەرمووی : ئەگەر توانات نەشکا بەسەر فێڵەکەیدا ، سامانەکەی پێبدەوه.

١٥- پیاوێک پرسیاری کرد له ئیمامی أحمد منیش گوێم لێ بوو وتی : من هەندێک درەهمم لایه ، دەم هەوێت بیگۆڕم به زیو؟
ئیمام فەرمووی : وەزن بەوەزن وەری بگره.

وتی : ئەگەر دینارم لابوو ، ویستم بیکەمە درهەم؟
فەرمووی : سەیرکە بزانە قیمەتی گەشتوەتە چەند ، ئەوکات وەری بگرە.

١٦- پرسیارکرا لە ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبوو ، دەربارەی پیاوێک هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێک دەکات ، هەزار درهەمی پێدا ، باوکی ئافرەتەکە هات ووتی : من هیچم لانیە لەگەڵی ئامادەی کەم ( مەبەست پێی ئەو شتانە بووە عادەتە بۆ بوک ئامادەکراوە لە ڕازاوی و پێویستیەک کە لەلایەن ماڵی بوکەوە ئامادە کراوە) ئەگەر دەتەوێت بەبێ ئەو ئامادەکاری و پێویستیە بیبەیت ئەوا بیبە.

ئیمامی أحمد فەرمووی : ئەو ئافرەتەکەی دەوێت ، ئەو پێداویستیانەی ناوێت ، بەبێ ئەوان بیبە.

١٧- ئیمامی أحمد فەرمووی : ئەگەر پیاوێک ووتی بە خێزانەکەی: حەقت بەدەستی خۆتە ، ئافرەتەکە بڵێت : من حەرامم لەسەرت ، ئەوا حەرام ئەبێت لەسەری.

١٨- گوێم لێبوو لە ئیمامی أحمد دەیوت : ئەگەر پیاو زەواج بکات لەگەڵ ئافرەتێک بەبێ وەلی ئافرەتەکە ، وە ئافرەتەکە لە پیاوەکە منداڵی بوو ، باشتر وایە ئەو پیاو و ئافرەتە جیابکرێنەوە .

ئیمامی أحمد فەرمووی : ابن المبارک یش وا دەڵێت.

١٩- پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد دەربارەی پیاوێک کە ڕەهنێکی داناوە لای پیاوێک ئەو پیاوەی ڕەهنەکەی لا دانراوە پێویستی بە پارکەیەتی کە لەبری پارەیەک لای دانراوە ئەو ڕەهنە پێی دەڵێت : ڕەهنەکەت بفرۆشە و پارەکەم بدەوە.

وتی : گەر لای نەبوو پێی بدات و ڕەهنەکەشی نەفرۆشت بۆی هەیە ڕەهنەکەی بهێڵێتەوە لای خۆی و پێی نەداتەوە؟

ئيمام فەرمووى : بۆى نيە ڕەهنەكە بفرۆشێت تەنها بە ئيزنى خاوەنەكەى نەبێت.

٢٠- گوێم لە باوكى عبدالله بوو ئيمامى أحمد ساڵى ٢٢٨هـ وە پرسيارى لێكرا دەربارەى كەسێك ئيحرامـى بەستوە و نێچيرێكـى كوشتووە ؟
فەرمووى : كەفارەتەكەى لە قورئاندايە[(١١)].

٢١- بيستم لە ئيمامى أحمد دەيفەرموو : هەموو شتێك لە قورئاندا (أو - أو) بۆ هەڵبژاردن و سەرپشك بوونە.

٢٢- گوێم لێبوو لە ئيمامى أحمد دەيفەرموو : يحى وتى : شعبە وتى : حكم لە مقسم[(١٢)] حەديسى كەڵەشاخى نەبيستوە[(١٣)].

---

(١١) الله سبحان وتعالى دەفەرمووێت: ( يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا لَا تَقْتُلُوا ٱلصَّيدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ ) واتـە : ئـەى ئـەوانـەى بـاوەڕتان بـە ئيـسلام هێنـاوە ، هـيـچ گيـاندارێك مەكوژن لە گياندارى وشكانى ، كاتێك ئێـوە لە حەرەمدان يان حج يـان عەمرە دەكـەن (تەنها چەند گياندارێك نـەبێـت كـە كوشتنيان جـائيزە ، وەك لـە بخـارى و مسـلم هاتوە) ئەگەر كوشتـان ئـەوا دەبێـت لـە هەمان ئـەوى كوشتوتانە ئاژەڵێك سـەرببڕن و گۆشتەكەى بدەن بە هەژاران ، يـان نرخەكەى ، يان بەڕۆژوو بن گەر تواناى كەفارەتەكەيان نەبوو.

(١٢) حكم تەنها حەديسى بيستوە لـە مقسم ، يحيـى كوڕى قطان ژماردوويەتى : حەديسـى ويتر ، حەديسـى قنوت ، حەديسـى عزمە الطالق ، پاداشتـى ئـەوەى دەكوژرێـت لـە وشتر ، حەديسـى پياوێـك دەچـێـتە لاى خێزانـى لـە كاتێـك لـە حەيزدايە.

(١٣) العلل للإمام أمحمد روايه عبدالله(٤٣٣٣) و مسند على بن جمد(٤١٩) بريتيە لـە حەديسـى ابـن عباس ، كە پێغەمبەرى خوا ﷺ كەڵەشاخى گرتوە و بەڕۆژوويش بووە.
ئيمامى أحمد لە مسند هێناويەتى(٢١٨٦ - ٢٢٢٨- ٢٥٣٦ - ٢٥٩٤).
طلياسي لە مسند هێناويەتى(٢٦٩٨) وە نسائى لە كبرى(تحفە : ٥/٢٢٤).

٢٣- پـرسيارکرا لـه ئيمامی أحمـد و منيش گوێبيست بـووم : دەربـارەی پياوێـک هاوسـەرگيری کردوە لەگەڵ ئافرەتێک لەسەر کۆيلەيەک ، ئايا ئەو پياوە بەندەکە ئازاد دەکات؟

ئيمام فەرمووی: نەخێـر ئـازادی ناکات ، ئەو بەندە دەبێتە هی ئافرەتەکە ( چونکە دەبێتە مارەيی ئافرەتەکە ).

٢٤- پرسيار کرا لە ئيمامی أحمد من گوێم لێ بوو ، دەربارەی پياوێک کە پياوێکی کـردوە بـە وەلی بەسەر کـچ و خوشـکەکەيەوە ، پێـی دەڵێـت : گـەر کەسێکت دۆزيەوە لێی ڕازی بويت ، بيانده بەشوو؟

ئيمام فەرمووی : زەواجەکە جائيزە.

٢٥- گوێم لێبوو ئيمامی أحمد دەيفەرموو : وای دەبينم ئەگەر پياو ويتری کرد سەلام بداتەوە لە دوو ڕکاتدا.

٢٦- پرسيارکرا لە ئيمامی أحمد منيش گوێم لێ بوو ، دەربارەی پياوێک کە پياوێکی تر درهەمێکی پێداوە و وتويەتی شتم بۆ بکڕە ئەويش تێکەڵی دەکات لەگەڵ درهەمێکی خۆی و هەردوکيان ون دەکات؟

ئيمام فەرمووی : هيچی لەسەر نيە.

٢٧- پرسيارکرا لـە ئيمامـی أحمد منيش گوێـم لێبوو : دەربارەی پياوێک دەيەوێت قوربانيەک بکات بەلام ونی دەکات و دانەيەکی ديکە دەکڕێت دوای ونبوەکەش دەدۆزێتەوە؟ فەرمووی : هەردووکيان سەرئەبڕێت.

٢٨- گوێم لێ بوو ئيمامی أحمد دەيفەرموو : دەربارەی ئەم ئايەتە ( وَالْهَدْيَ مَعْكُوفًا أَنْ يَبْلُغَ مَحِلَّهُ ) [ ا لفتح : ٢٥ ] ، واتە : موشريکين نەيانهێشت قوربانيەکان بگاتە جێی خۆی بۆ سەربڕين.

ئيمام فەرمووی : هەتا دەگاتە حەرەم ( واتە ئەو شوێنە بريتيە لە حەرەم ).

٢٩- پرسیارکرا لە ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبوو : دەربارەی پیاوێک دەرچوە بۆ پێویستیەک ، وە مەبەستی حەج کردن نیە ، دەرچوە لە ذا الحلیفة و پاشان دەیەوێت حەج بکات؟

ئیمامی أحمد فەرمووی : دەگەڕێتەوە بۆ ذا الحلیفة و احرام دەبەستێت.

٣٠- ئیمامی أحمد فەرمووی : ئەگەر نەسرانیەک موسڵمان ببێت لە مەککە پاشان بیەوێت حەج بکات ، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ذا الحلیفة و احرام دەبەستێت.

٣١- أحمدی کوڕی حنبل بۆی گێڕاینەوە ، وتی : سوفیان وتی ، لە ابن جریجەوە ، لە عطاء وە فەرمویەتی : گەر سەفەریکرد بەسەفەرێک نوێژی تێدا کورت کرایەوە ، عومرەکەی تەواو بوو.

ئیمامی أحمد فەرمووی : واتە عومرەکەی کۆتایی دێت [١٤].

٣٢- گوێم لە أحمد بوو دەی وت : یەزید حەدیثێکی بۆ گێڕاینەوە ، وتی : شوعبە بۆی گێڕاینەوە لە ئەشعەثی کوڕی سولەیمەوە ، وتی : بەڵام حەدیثەکە لە یحیی ـی کوڕی أبو سلیمەوە یە ، أبی بلج یەزیدی کوڕی هارون فەرمووی : گوێم لەو حەدیثە بوو ، وە من لەو کاتەوە گوێم لێی بوو لێی دودڵ بووم لە بغداد گوێم لێی بوو ، واتە لە شوعبەوە من لە کۆتایی خەڵکەکە بووم.

٣٣- گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەیفەرموو : دراوردی کۆمەڵێک حەدیس دێنێت نازانم چین ، وەک ئەوەی ئینکاری بکات[١٥].

---

(١٤) واتە گەر لەمانگەکانی حەجدا عەمرەی کرد ، پاشان فەرێکی کرد لەدوای عەمرەکەی بەڕادەی کورت کردنەوەی نوێژ تێیدا ، ئەوکاتە نابێتە عەمرەی تمتع ، واتە حەج و عەمرە لەهەمان ساڵدا.
مسائل عبدالله ٨٢٠.

(١٥) هاتوە لە(العلل و معرفة الرجال) لە ئیمامی أحمد ، بە ڕیوایەتی مروذي(بە ژمارە : ٢١٠) : پرسیارم کرد لە ئیمامی أحمد دەربارەی دراوردي ، فەرمووی : نازانم چیت پێبڵێم دەربارەی ، دەربارەی حەدیسەکانی ، وەك ئەوەی ئینکاری هەندێکیان بکات.

٣٤- ئیمامی أحمد ـم بینـی كاتێک له نوێژ سەلامی دەدایەوە ، ڕووخساری وەردەگێڕا له قیبله و دادەنیشت و زیکری الله ـی دەکرد.

٣٥- پرسیار کـرا لـه ئیمام أحمـد منیش گوێـم لێبوو ، دەربارەی پیاوێک بیست دیناری داوەتە پیاوێک تا بەو پارە شتێکی بۆ بکڕێت ، تێکەڵـی دەکات له گەڵ پارەکانـی خۆی تـا دەڕوات و شتـی بۆ دەکڕێـت ، ئیمام وای دەبینی هیچ کێشەی نەبێت ئەم کارە .

٣٦- باوکـی عبدالله ـم بینـی (واته ئیمامـی أحمد) نوێژی بـۆ دەکردین کاتێک قـامەت دەکـرا ، بـەلای ڕاسـت و چـەپ لای دەکـردەوە و دەیـفەرموو : ڕێـک بوەستن.

٣٧- گوێم لێبوو له ئیمامـی أحمدەوە دەیفەرمـوو : (جندب) واتـه کوڕی سفیان هاوەڵایەتی کۆنی نیه[١٦] .

٣٨- پرسیارکرا له ئیمامی أحمد دەربارەی حەدیسی عەمری کوڕی حزم له خێرکردن : ئایا ئەو حەدیسە ڕاستە؟
فەرمووی : وای بۆ دەچم ڕاست بێت[١٧] .

---

(١٦) جندبی کوڕی عبدالله ـی کوڕی سفیان البجلی پاشان العلقی ، باوکی عبدالله.

(١٧) مەبەستی پێی ئەو حەدیسەیە کە حکمی کوڕی موسی له یحیی ـی کوڕی حەمزەوە ، له سلیمانی کوڕی داودەوە ، لـه زوهریـیەوە ، لـه أبوبکـری کـوڕی محمدی کـوڕی عەمری کوڕی حـزم ، لـه باوکیەوە ، لـه باپیریەوە ، کـه رسـول الله ﷺ بـۆ خەڵـکی یەمـەن کتابێکـی نـوسی تێیـدا واجبـات و سونەتـەکـان و ئەو پارەی لەبـری تـاوانێك دەدرێت ئایا کوشتنی بێت یان جگه لەوانه ، به عەمری کوڕی حەزمدا ناردی ، ئەویش بۆ خەڵکی یەمەنی خوێندەوە ، نسائی(٨/٥٧)، حاکم له مستدرك (١/٣٩٥).
بهقی له الکبری (٤/٣٥٢ و ٨ /٨٨ و ٨٩ ). بەڵام حەدیسەکە زەعیفە.

**٣٩-** پـرسيار كـرا لـه ئيمامـی أحمد و منيش گوێبيستی بووم ، دەربـارەی پياوێـك وەسێتی كردوە هێسرێك بكرِن بە هەزار دينار بۆ جيهاد ، وە سەديشی بۆ نەفەقە؟

ئيمامـی أحمد فەرمـووی : بۆی دەكرِدرێت وەك ئەوەی وەسيەتی كردوە ، زياد ناكرێ لەسەرو ئەمەوە هيچی تر.

ووتی : ئەگەر بـە كەمتر لـە هەزار ، بـە پێنج سەد درهەم دەستی كەوت ، يان زياتر؟

ئيمام فەرمووی : نەفەقەكەی پێ زياد دەكرێت.

**٤٠-** پرسيـاركرا لـە ئيمامـی أحمد و منيـش گوێـم لێبوو : دەربـارەی ئەو ئافرەتانـەی خـوێنيان هەيە بەهـۆی منـداڵ بونـەوە ، چـەنێك دانيشـن ئەگـەر خوێنيان بينی؟

فەرمـووی : چل رۆژ پاشان خۆی دەشوات[١٨].

**٤١-** بۆيگێرِامەوە باپيرم ووتـی : باوكـی بەدر بۆی گێرِامەوە ، لە علی كورِی عبد الاعلی، لـە باوكـی سەهل ـەوە ، لە مسه الأزديه ، لە أم سلمه ، هاوسەری پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئافرەتانێك كە مناڵيان بوە ، چل رِۆژ دادەنيشتن ، وە رِوخسارمـان بـە گوڵـی ورس رِەنگ دەكـرد ، كـە رِەنگێكە لـە نێـوان سور و رِەش [سورێكی تۆخ].

(١٨) أخرجه الدار قطني في السنن(١/٢٢٢) ، ابن رجب له فتح دەفەرمووێت ٢/١٥١ : رِای درووست ئەوەيە ئەگەر لە پێش ٢٠رِۆژ خوێنی نەما و پاك بوويەوە دەبێت رِۆژوو بگرێت و نوێژيش بكات.
لـە أم سلمەوە كـە پرسياری كردوە لـە پێغەمبەر ﷺ ئايا : ئافرەت چەنديـك دابنيشێت ئەگەر منداڵی بوو (واتە لە نوێژ و رِۆژوو بوەستێت) فەرمووی : ٢٠ رِۆژ بەلام پێش ئەوە پاك بوويەوە دەبێت نوێژ و رِۆژووی ئەنجام بدات.

٤٢- پـياوێک ووتـی بـه ئيمامـی أحـمد ، وه منـيش گوێـم لێبوو : مـن دراوسێيەکەم هەيە کاتێک داوای شتێکی لێدەکەم پێم دەدات ، پاشان ئەويش دێت پارەم لێ قەرز دەکات ، ئايا من داوای لێبکەم وەک ئەوەی پێشتر داوای شتم لێکردوە؟

ئيمامی أحمد فەرمووی : هەموو قەرزێک سودی تێدا بەکاربێت حـەرامە (ئەو قەرزەکەی بۆيـە داوە تـا بتوانێت پارەی لێ قەرز بکـات ئەمەش حـەرامە چونکە پێدانی قەرز لەبەر قازانج درووست نيە).

٤٣- پياوێک پرسياری کرد لە ئيمامی أحمد منيش گوێم لێبوو ، ووتی : من چومە بازاڕ لەوێ جلێکم بينی خاوەنەکەی بانگی دەکرد دەيوت بە بيست صحاح ، منيش کڕيم و مقطەم پێ دا ئيمام فەرمووی : نەخێر ، تەنها ئەوکاتەی کە دەبێت ڕازيبێت خاوەن جلەکە کە ئەوەی پێبدەيت.

٤٤- وه پرسیارکرا لە ئيمامـی أحمد و منيش گوێـم لێبوو : دەربارەی وتنی زيـکر لـەسەر شێـوازی شيعر و بـەکارهێنانی ئالەتی موسيقی لەگەڵيدا؟

ئيمامی أحمد فەرمووی : پێم خراپە[١٩].

---

(١٩) ئيمامـی ابـن أبـی حامت لـە مناقب الشافعی پەڕەی (٣٠٩-٣١٠) بـە سەنەدێکـی ڕاست هێـناويەتـی : ئيمامی شافعی دەفەرمووێت : لە عێراق شتێك ئەنجـام دەدرا پێـی دەوتـرا تغبير (واتـە : هۆنينـەوەی شيعر لـە مەجليسـی زيکردا بـە ئاواز و ئالەتـی موسيقی ) ، زەنادیقەکـان دایانهێنابـوو ، خەڵکیـان پـێ مەژغوڵ ئەکرد لە قورئان ، بۆ ئەوەی لەبری قورئان خەريکی ئەوە بن.

٤٥- پرسیارکرا له ئیمامی أحمد و منیش گوێم لێبوو : دەربارەی سڕینی شوێنەواری دەستنوێژ له دوای دەست نوێژ؟
ئیمامی أحمد به باشی نەزانی[٢٠].

٤٦- گوێم لێبوو له ئیمامی أحمد ، دیفەرموو : بیلال بانگی دەدا بۆ پێغەمبەر ﷺ لەدوای ئەوەی گەشته مەدینه .

٤٧- پیاوێک پرسیاری له ئیمامی أحمد کرد منیش گوێم لێبوو وتی : شتێکم به کرێم گرت له بغداد بۆ مەککه ، کاتێک گەشتمه کوفه بۆم ڕوونبویەوە؟
ئیمام فەرمووی : دەبێت هەقی خۆی پێبدەیت ، یان بیدەیته دەست غەیری خۆی.

٤٨- پرسیارکرا له ئیمامی أحمد منیش گوێ بیست بووم ، ئایا ئافرەت حەج دەکات له کاتی عیدەدا؟ فەرمووی : بەڵێ.

٤٩- وترا به ئیمامی أحمد : ئەگەر ئافرەتێک لەگەڵ پیاوەکەی بوو له ڕێدا پیاوەکەی مرد؟
ئیمام فەرمووی : هاوەڵایەتی خەڵکی دەکات ، ئەگەر مەحرەمی نەبوو.

٥٠- وترا به ئیمامی أحمد : ئافرەت له ماڵ دەچێته دەر بەبێ مەحرەم لەگەڵ دراوسێکەی ؟
ئیمامی أحمد فەرمووی : نەخێر.

---

(٢٠) ڕوخسەت هەیه و دەتوانرێت بکرێت وەك ابن المنذر له الأوسط هێناویەتی (١/٤١٥)به سەنەدێکی حەسەن له عبدالله ی کوڕی أبوبکر : که أنسی کوڕی مالکی دیوه ڕووخساری وشک کردووەتەوە بەو پۆشاکەوە که لەسەریدا بووە له دوای دەستنوێژ.

٥١- گوێم لـه ئیمامـی أحمـد بوو دەیفەرموو : ابن أبی ذئب[٢١] ، سیقەیە ، حەدیسی کەمە ، وە کەسێکی چاکەکارە و قسەی حەق دەکات.

٥٢- گوێـم لـه ئیمامـی أحمد بوو دەیفەرمـوو : ابـن أبـی ذئب لە سعیدی کوڕی مسیب دەچێت[٢٢].

٥٣- گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەیفەرموو : ئەگەر پیاوێک شتێکی کڕی لە پیاوێک ، وە کڕیار دەیزانی ئەو کەسە ئەو شتەی دزیوە ، ئەوا لەو کارە لەگەڵی بەژدارە.

٥٤- گوێـم لـە ئیمامـی أحمد بـوو دەیفەرموو : عبداللە ـی کوڕی وهب زانا و چاکەکارە فەقیهە و زانستی زۆرە[٢٣].

٥٥- ئیمامی أحمد فەرمووی : هەواڵـی پێدام کەسێک ، کە ابن أبی حازمی دیوە بۆچوونی مالکی بۆ خستوەتەڕوو.

٥٦- گوێـم لـە ئیمامـی أحمد بوو دەیفەرموو : رشدین وای دەبینـم جێـی سیقەیە ، یان حەدیسی چاکە[٢٤].

٥٧- گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو : گەر پۆشاکێکت دۆزیەوە لە ڕێگا ساڵێک بیناسێنە تاخاوەنی پەیدا دەبێت پاشان بیفرۆشە ، وە پارەکەی بکە خێر ئەگەر چەن درهەمێکت دۆزیەوە ، ساڵێک بیناسێنە ، پاشان بیکە خێر[٢٥].

---

(٢١) محمد کوڕی عبدالرحمن کوڕی موغەیرە کـوڕی حارث کـوڕی أبـی ذئب قورەیشی عامری ، باوکی حارث مدنی ، ١٥٨هـ وەفاتی کردووە(التقریب : ٢/١٨٤).

(٢٢) علل و معرفة الرجال بروایە عبداللە(١١٩٥ ، ١١٢٢ ، ٤٧٩).

(٢٣) عبداللە ـی کوڕی وهبی کوڕی مسلـم ، متمانەپێکراو و خواناسـە ، ساڵـی ١٩٧هـ وەفاتـی کردوە (التقریب : ١/٤٦٠).

(٢٤) معجم الصحابة للبغوي٣/٥٤٣(١٥٣٧)، الکامل لابن ٢/(٦٦٩)،تهذیب التهذیب٢/(٢٧٨٠).

(٢٥) الموطا ٤٧١.

٥٨- گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەیفەرموو : ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ ئەوا نوێژ ناکرێت جگە لە فەڕز.

٥٩- گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەیفەرموو : ئەگەر پیاوێک گوێی لە قامەت بوو ، وە دوو ڕکات نوێژی پێش بەیانی نەکردبوو ، دەچێتە نوێژە فەڕزەکە دەکات.

٦٠- گوێم لە ئیمامی أحمد بوو پرسیاری لێکرا دەربارەی وەرگرتنی پاداشت لە بەرامبەر کردنی کەڵەشاخ؟ فەرمووی : خراپترین کەسابەتە[٢٦].

٦١- پیاوێک پرسیاری لەئیمامی أحمد کرد منیش گوێم لێبوو وتی : چەن الله اکبر بکەم لەسەرجەنازە؟

فەرمووی : چوار ، وە سەلامێکیش دەدەیتەوە.

٦٢- باوکی قاسم وتـی : من ئیمامـی أحمد ـم دی چوار جار الله اکبری کرد لەسەر جەنازە ، پاشان سەلامی دایەوە بەلای ڕاستدا ، وە چوە گۆڕستان و نەعلەکانی بەدەستەوە گرتبوو ، بەدەستی ڕاستی.

٦٣- پیاوێک پرسیاری لە أحمد کرد ، وەمنیش گوێم لێی بوو ، دەربارەی پیاوێک کە پیاوێک کۆمەڵێ پارەی دراوی لێ قەرز کردوە ، بەڵام ئەم پارەی ساغی لێوەر دەگرێتەوە؟

ئیمام فەرمووی : گەر وەک پاداشتێک و بەخواستی خۆی پێی دا ، لێی وەرەگرێت بەڵام بیکاتە مەرج بەسەریەوە ، نەخێر.

---

(٢٦) بخاري ٩٩/٣ ,مسلم ٨٧/٧ ,الحميدي ٤١٢ ,النسائي ٢١١/٥ . ( لة حةديسي رافعي كوري خديج)
بەلام گـەر کابرای کەلەشاخ گرەوە داوای پاداشتێکـی کـرد لـە بەرامبەر کـارەکەیدا ئەوا پێـی بدەن.
أخرجە بخاري ومسلم و أمحد.

٦٤- پرسيار كرا له ئيمامی أحمد من گوێم لێی بوو دەربارەی پیاوێک دەردەچێت بۆ نوێژ؟ ، دەبینێت نوێژیان کردوە و جەماعەت تەوا بوە وە دەبینێت پیاوێک دەست نوێژ دەگرێت ئایا سونەت بکات تا ئەو پیاوە دێت؟

فەرمووی گەر ویستی با سونەت بکات تا ئەودێت.

٦٥- پرسیارکرا له ئیمامی أحمد منیش گوێبیست بووم ، ئایا ئافرەت توشی حیض دەبێت لەکاتی دووگیانیدا؟

ئیمام فەرمووی : جیاوازن تێیدا ، تەنها ئەوەی واز له نوێژ ناهێنێت( واته جیاوازن ئایا ئافرەت لەکاتی دووگیانیدا توشی حیض دەبێت یان نا ، بەڵام نابێت واز له نوێژەکەی بهێنێت).

٦٦- پرسیارکرا له ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبو، دەربارەی پیاوێک ونبوە؟

ئیمام فەرمووی : ماڵەکەی دابەش دەکرێت دوای چوار ساڵ.

٦٧- گوێم له ئیمامی أحمد بوو دەیفەرموو : حسن حەدیسی گێڕاوەتەوە له علی کوڕی أبو طالب[٢٧] و معقلی کوڕی یسار[٢٨] و ثوبان[٢٩].

---

(٢٧) حسن کوڕی أبی حسن ، یساری بصري ، ڕیوایەتەکانی له ئیمامی علی ـەوە مرسەله.

(٢٨) گوێم لێبوو لەباوکمەوە وتی : حسن لە معقلی کوڕی یسارەوە گوێبیست نەبووە (المراسیل پەڕەی٤٢) وە پرسیارکرا لە أبو زرعەی رازی : حسن لە کامیان گێڕاویەتیەوە؟ معقلی کوڕی یسار یان معقلی کوڕی سنان ؟ حسن لە معقلی کوڕی یسار گێڕاویەتیەوە ، لە معقلی کوڕی سنان ئەگەری زۆر دوورە. ئیمامی بخاریش لە سەحیحەکەیدا لە (بابی نکاحدا ، باب لانكاح الى بولی) لە ڕێگەی یونس ، لە حەسەنەوە معقلی کوڕی یسار ....... حديث.

(٢٩) حسن گوێبیست نەبووە له ثوبان (التذهیب ٢/٢٣١)

٦٨- باپيرم بۆى گێڕامەوە ووتى : بۆى گێڕاينەوە هشيم ، وتى : بۆى گێڕاينەوە يونس لە حسن ئەويش لە على كوڕى أبو طالب كە وتى : گوێم لێبوو لە پێغەمبەرەوە ﷺ ، كە فەرمووى : قەڵەم بەرزكراوەتەوە لەسەر سێ نەفەر ( واتە تاوانيان لەسەر نانوسرێت ) بچوكێك تا ژيرى گەشە دەكات ، نوستويەك تاوەك و هەڵدەستێت ، شێتێك تاوەك و باش دەبێت و ژير دەبێت.

٦٩- باپيرم بۆى گێڕامەوە وتى : هشيم بۆى گێڕاينەوە وتى : خالد هەواڵى پێداين لە ضحى ەوە ئەويش لە على ـەوە بەهەمان شێوەى پێشوو.

٧٠- باپيرم بۆى گێڕامەوە رحمه الله ، وتى : بۆى گێڕاينەوە داودى كوڕى زەبورقان لە سعيد ئەويش لە قتادەوە ئەويش لە حەسنەوە ئەويش لە على ـەوە : ئەويش لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ ، هەمان حەديسى پێشوو[٣١].

٧١- شيبان بۆى گێڕاينەوە ، سلامى كوڕى مسكين بۆى گێڕاينەوە ، أبو عتاب بۆى گێڕاينەوە لە حەسەنەوە ، وتى : زيلد چوە لاى معقلى كوڕى يسار ، كە نەخۆش بوو ، سەردانى دەكرد ، سۆز و دڵ نەواى پێشكەش دەكرد ، لەو كاتەدا معقلى كوڕى يسار وتى : گوێم لێبوو لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ دەيفەرموو : هيچ واليەك نيە كارێك لە كارەكانى موسڵمانانى لە ئەستۆ بێت ، هيچ ئامۆژگاريەكى بۆ جێ نەهێشتبن ئەوا الله لەسەر ڕوخسارى دەيخاتە جەهەنەم ئەو ڕۆژەى الله كۆتا و سەرەتاى دروستكراوەكان كۆدەكاتەوە[٣٢].

(٣١) زەعيفە داودى كورى زەبرقانى تيدايە كە متروك الحديثة ، قال ابن منيع ليس بشيىء.

(٣٢) سەنەدەكەى حەسەنە ، أبوعتاب سەهلى كوڕى حمادى دلالە ، كەسێكى ڕاستگۆيە وەك لە ( التقريب : ١/ ٢٣٥_٢٣٦) هاتوە.

٧٢- شيبان بۆی گێڕاینەوە ، باوكی أشهب بۆی گێڕاینەوە لە حەسەنەوە كە معقل وتـی : عبدالله ـی كـوڕی زیاد گوێـم لێبوو لـە پێغەمبەری خـواوە ﷺ دەیفەرموو : هیچ بەندەیەک نیە الله كەسانێكی خستبێتە ژێردەستی و بمرێت ڕۆژی مردنی ، وە خیانەتی كردبێت لە ژێردەستەكانی ئەوا الله بەهەشتی لەسەر حەرام دەكات(٣٣).

٧٣- گوێم لـە ئیمامـی أحمد بـوو كـە پرسیاری لێكرا دەربارەی حەدیسـی عەمری كوڕی حزم لە خێركردندا ، ئایا صحیحە؟
فەرمووی : وای دەبینم صەحیح بێت.

٧٤- لە حەدیسی خێركردندا ، بۆی گێڕامەوە حەكەمی كوڕی موسی ، وە مـن پرسیارم لێی كرد ، بۆی گێڕاینەوە یحیای كوڕی حەمزە لە سلیمانی كوڕی داودەوە وتی : زوهری بۆی گێڕامەوە لە أبوبكری كوڕی محمدی كوڕی عەمری كوڕی ئەویش لە باوكیەوە ، ئەویش لە باپیریەوە كە : پێغەمبەری خوا ﷺ نوسی بۆ خەڵكی یەمەن نوسراوێک دەربارەی واجباتەكان ..... وە حەدیسەكە باسكرد.

٧٥- گوێـم لە ئیمامـی أحمـد بـوو : پرسیاری لێكرا دەربـارەی گێـڕانەوەی ڕەمـەزان بـە پچڕ پچڕ(واـتە هەمـوو ئەو ڕۆژانەی قەرزار بووە بەسەریەكەوە نەی گێڕاوەتەوە) ؟
فەرمـووی : واینابینم كێشەی هەبێـت(٣٤).

---

(٣٣) حەدیسێكی سەحیحە ، بخاری ڕیوایەتی كردوە (٤/٢٣٥) ، وە مسلم (٣/١٤٦٠).
(٣٤) مسائل إمام أحمد و إسحاق بن راهویه بروایه اسحاق بن منصور ٧١٥.

٧٦- بۆی گێڕاینەوە ابی أبی شیبە ، بۆی گێڕاینەوە یەحیای کوڕی سولەیم ، لە موسی ــ ی کوڕی عوقبەوە لە محمدی کوڕی مونکەدیرەوە وتی : پێم گەشتوە کە رسول الله لە گێڕانەوەی ڕۆژوی ڕەمەزاندا فەرموویەتی : بۆ ئەوە ، ئایا نابینیت گەر لەسەر هەریەک لە ئێوە قەرزێک هەبێت ئاساییە درهەمێک یان دوو درهەم قەرز بدداتەوە ، بەسەر یەکیش نەبێ ئاساییە؟

ئایا هەر دانەوەی قەرز نیە؟

الله لێ خۆشبوو تر و میهرەبان ترە بۆ بەندەکانی.

٧٧- أبوبکر ــ ی کــوڕی أبو شیبە بــۆی گێڕاینەوە ، بۆی گێڕاینەوە حفص ــ ی کوڕی غیاث ، لە ابن جورەیجەوە ، لە عطاء وە ، لە ابن عباس و لە أبی هریرەوە ، کە فەتوایان داوە بۆ خەڵکانێک بە گێڕانەوەی ڕەمەزان بە لێک پچڕان و بەسەر یەکەوە نەبوو[٣٥].

٧٨- أبوبکــر ــ ی کــوڕی أبــو شیبە بــۆی گێڕاینەوە ، کــوڕی ئیدریس بــۆی گێڕاینــەوە ، لە شعبەوە ، لــە عبدالحمید ــ ی کوڕی رافعی کوڕی خدیجەوە ، لە داپیریەوە ، کە رافعــی کوڕی خدیج دەیوت : عیدەکەت حساب بکە بــە ڕۆژو بە چۆنت ویست (واتە بەسەریەکەوە بیانگێڕیتەوە یان بە جیا).

٧٩- أبوبکر بۆی گێڕاینەوە لە یەزیدی کوڕی حوبابەوە ، لە معاویەی کوڕی سالحەوە ، لە موسی ــ ی کوڕی یەزیدی کــوڕی موهب ، لە باوکیەوە ، لە مالکــی کــوڕی مخامیرەوە ، لە موعاز ــ ی کوڕی جەبەلەوە ، فەرموویەتی : حسابی بکە و بەڕۆژوو بە چۆنت دەوێ ، لە گێڕانەوەی ڕەمەزان.

---

(٣٥) حــەدیسەکــە ــی ســەحیحە ، ابـن أبـی شیبـە لـە مصنف هێنـاویـەتـی بـە ژمـارە (٢/٢٩٢) وە عبدالرزاقیش (٧٦٦٤).

٨٠- أبوبكر ــی کوڕی أبو شیبه بۆی گێڕاینەوە ، بۆی گێڕاینەوە معتمر ، لە باوکیەوە ، وتــی : بەکر هەواڵــی پێــدام لــە ئەنەسەوە ، وتــی : ئــەگەر ویستت ڕەمەزانــی لــە دەســت چوو بگرەوە بەسەر یەکەوە ، وە ئــەگەر ویستت بــە جیا بگرەوە[٣٦].

٨١- باپیرم بــۆی گێڕامەوە کــوڕی عویەینە بــۆی گێڕاینەوە ، لە زوهریەوە ، گێڕایەوە لەوەی بیستبووی لە أبو هرەیرەوە ، دەیفەرموو : عیدەکەت حساب بکە و ڕۆژووەکەت بگرە چۆنت پێخۆشە.

٨٢- بــاپیرم بــۆی گێڕاینەوە ، حماد ــی کــوڕی خالد بــۆی گێڕاینــەوە ، وە أبوبکری کوڕی أبی شیبە بۆی گێڕاینەوە ، بــۆی گێڕاینەوە زەیدی کوڕی حباب ، وتیان : معاویەی کــوڕی ساحل بۆی گێڕاینەوە لە ئەزهەری کوڕی سەعدەوە ، لە باوکــی عامری هوزنــی ، لە باوکی عبیدەوە ، وتــی : گوێــم لێبوو باوکــی عامری هوزنــی دەیوت دەربــارەی گێڕانەوەی ڕەمــەزان : جیای بکەنەوە ، وە بەڕۆژوو بە چۆنت ویست[٣٧].

٨٣- أبوبکری کوڕی أبی شەیبە بۆی گێڕاینەوە ، کوڕی علیە بۆی گێڕامەوە ، لــە معمرەوە ، لــە زوهریەوە ، لــە عبــدالله ــوە لــە ابــن عبــاسەوە ، دەربــارەی گێڕانەوەی ڕەمەزان فەرمووی : بە ڕۆژوو بە چۆنت ویست[٣٨].

(٣٦) صحيح ، رواه ابن أبي شيبة (٢/٢٩٢).
(٣٧) صحيح ، رواه ابن أبي شيبة (٢/٢٩٤).
(٣٨) صحيح ، رواه ابن أبى شيبه(٢/٢٩٣) ، عبدالرزاق في المصنف (٧٦٦٥).

٨٤- أبوبكر بۆی گێڕامەوە ، وكیع بـۆی گێڕامەوە ، لـە سفیان ، لـە حبیبی کـوڕی أبـی ثابـت ، لـە عطاء ، لـە عبیدی کوڕی عومەیر ، دەربارەی گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان وتی : کێ ویستیبە جیا بیگێڕێتەوە[٣٩] .

٨٥- باپیرم بۆی گێڕاینەوە ، وە أبوبکری کوڕی أبی شەیبە ، وتیان : ابن علیە بۆی گێڕاینەوە ، أیوب بۆی گێڕاینەوە ، لە باوکی قلابەوە لە عبدالرحمن ـی کوڕی محیریز ، وتی : عدە بژمێرە و بەڕۆژوو بە چۆنت ویست[٤٠] .

٨٦- أبوبکری کوڕی أبو شەیبە بۆی گێڕاینەوە ، ابن ادریس بۆی گێڕامەوە ، لە لیس و عطاء و طاوس و مجاهد و سەعیدی کوڕی جبیر ، وتیان : ئەگەر ویستت بەدوای یەک بیان گرەوە ، ئەگەر ویستت بە جیا بیان گرەوە.

٨٧- أبوبکـری کـوڕی أبـو شـەیبە بـۆی گێڕاینەوە ، بـاوکـی أحوص بـۆی گێڕامەوە ، لە باوکـی اسحاق ، لـە مجاهد ، وتـی : ئەگەر ویستـی بەسەریەکەوە دەیگرێت ، ئەگەر ویستی بە جیا دەیگرێت[٤١] .

٨٨- باپیرم بۆی گێڕامەوە ، حمادی کـوڕی خالد بۆی گێڕامەوە ، لە لیثەوە ، لە معاویەوە ، لە عبدالله ـوە ، لـە باوکیەوە ، لـە مالکی کـوڕی مخامرەوە ، لـە معازی کـوڕی جبلەوە ، وتـی : جیای کەرەوە و عیدەکـەت بژمێرە.

٨٩- أبوبکر بۆی گێڕامەوە ، أبوداودی طیالیسي بۆی گێڕاینەوە ، لە زهری ، لـە أبـی اسحاق ، لـە پیاوێک لـە هاوەڵانـی أبـی مەیسەرە ، کـە أبـی مەیسەرە گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزانی بە سەریەکەوە نەدەگرت.

---

(٣٩) صحيح ، رواه عبدالرزاق (٧٦٦٦).

(٤٠) اسناده صحيح ، رواه ابن أبی شيبه(٢/٢٩٢).

(٤١) انساد رجاله ثقات ، رواه ابن أبي شيبة(٣/٢٩٣).

٩٠- أبوبكر بۆی گێڕاینەوە ، عبده بۆی گێڕاینەوە ، له مجاهد ، له شعبی كه فەرمووی : ئەگەر گێڕانەوەكە قورس بوو لەسەری كه بەسەر یەكەوە بیگێڕێتەوە ئەوا به جیا دەیگێڕێتەوە ، له ڕۆژانی تردا له دوای نەخۆشیەكەی.

٩١- أبوبكر بـۆی گێڕامەوە ، عبد الله علی بۆی گێڕامەوە ، لـه داود ، له عكرمه ، فەرموویەتی : (فعدة من أيام أخر) ئەگەر ویستی پێكەوەبێت ، ئەگەر ویستی به جیا دەیگرێت[٤٢].

٩٢- أبوبكـر بـۆی گێڕاینــەوە ، یزیـدی كـوڕی هارون بـۆی گێڕاینەوە ، لـه جوبەیرەوە ، له ضحاكەوە وتـی : ئـەگەر ویستت بەسەر یەكەوە بیانگرە ، ئـەگەر ویستت به جیا بیانگرە[٤٣].

٩٣- أبوبكری كوڕی أبــی شیبه بۆی گێڕاینەوە ، بـۆی گێڕاینەوە ابن نمیر ، له اسماعیلی مەكی ، له ربیعەوە ، له عطاء ـوە له یەسارەوە ، وتــی : كێشەنیه ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزان به جیا بگیرێتەوە.

٩٤- باپیرم و أبوبكـری كـوڕی أبـو شیبه بـۆیان گێڕامەوە وتیان : كسیری كـوڕی هشام بـۆی گێڕاینەوە ، لـه جەعفەری كـوڕی بورقانەوە لـه مەیمونەوە فـەرمـووی : گێـڕانـەوەی ڕەمـەزان لـه ڕۆژانــی تـردا دەبـێـت دوای نـەمـانــی عوزرەكـە[٤٤].

٩٥- أبوبكری كوڕی أبو شیبه بۆی گێڕاینەوە ، ابن أبی غنیه بۆی گێڕاینەوە ، لـه باوكیەوە ، لـه حەكەمەوە ، وای نەدەبینــی بـه گێڕانەوەی ڕەمەزانــی بەسەر یەكەوە نەبوو كێشەی هەبێ[٤٥].

---

(٤٢) إسنادة صحيح ، رواه ابن أبي شيبة (٢/٢٩٣).

(٤٣) مصنف لإبن أبي شيبة ٩٢١٤ .

(٤٤) إسناده حسن ، ابن أبي شيبة (٢/٢٩٣).

(٤٥) إسنادة صحيح ، رواه ابن أبي شيبة في المصنف (٢/٢٩٣).

**٩٦-** باپیرم بۆی گێڕامەوە ، أبو قطن بۆیگێڕامەوە ، شعبە بۆی گێڕاینەوە ، لـە حەکەمەوە ، وتـی : ابـن جریر و مجاهـد دەیان فەرمـوو : کێشـەی نـیە گێڕانەوەی ڕەمەزان پچڕ پچڕ[٤٦] .

**٩٧-** باپیرم بۆی گێڕامەوە ، ابـن علیه بۆی گێڕاینەوە ، داودی کـوڕی أبـی هند بـۆی گێڕاینەوە، وتـی : عکرمە لە گێڕانەوەی ڕەمەزاندا دەی گێڕایەوە چۆنی ویستایە[٤٧] .

**٩٨-** گوێم لە أحمدی کوڕی حنبل بوو دەی فەرموو : لە پەنجەکاندا دە دە یە لە وشتر (بۆ هەر پەنجەیەک دە وشتر).

وە بۆ لوت گەر بڕا خوێنی کەسێکی تەواوە (١٠٠وشتر).

وە بۆ نینۆکەکان پێنج یەکی پەنجەکانە[٤٩] .

**٩٩-** حکمی کوڕی موسی بۆی گێڕاینەوە ، بۆی گێڕاینەوە یحیی ـی کوڕی حەمزە ، لەسلیمانی کوڕی داودەوە ، وتی : بۆی گێڕامەوە زوهری ، لە أبی بکری کوڕی محمدی کوڕی حزم ، لە باوکیەوە ، لە باپیریەوە : نوسی بۆ ئەهلی یەمەن کتابێک کـە تێیدا هاتـبوو : لە پەنجەیەک لەپەنجەی دەست یان قاچ ١٠ وشتر خوێن بایی هەیە.

---

(٤٦) إسناده صحيح.

(٤٧) إسناده صحيح.

(٤٨) مسائل للإمام أحمد بن حنبل و اسحاق بن راهوية ٢٣٨٨.

(٤٩) مسائل إمام أحمد بريواية ابنه عبدالله ١٥٢١.

١٠٠- أبـو قاسمـى كـوڕى منيع دەفەرمووێـت : مصعبـى كوڕى عبدالله ــى كوڕى الزبيرى باسيكرد وتى : بۆى گێڕامەوە مالكــى كوڕى أنس ، له عبدالله ــى كوڕى أبى بكرى كوڕى محمدى كوڕى عەمرى كوڕى حزم ، له باوكيەوە : لەو كتابەى رسول الله ﷺ نوســى بۆ عەمرى كوڕى حزم هاتبوو : لوت ئەگەر بڕا ١٠٠ وشترە[٥٠] ، ابن منيع دەڵێت : مصعــب بۆى گێڕاينەوە تێنەگەيشتم.

١٠١- باپيرم بــۆى گێڕامەوە ، هشيــم بــۆى گێڕامەوە ، ابـن أبــى ليلى بـۆى گێڕامــەوە ، لــه عكرمــەوە ، كـه رسـول الله ﷺ حـوكمـى كـرد لـه بڕينــى لوت به ١٠٠ وشتر ، وە لەپەنجەكان دە دە (واتە هەرپەنجەيەك ١٠ وشتر ، دە پەنجە ١٠٠ وشتر دەكات[٥١].

١٠٢- باپيرم بۆى گێڕامەوە ، هشيم بۆى گێڕامەوە ، أشعث بۆى گێڕاينەوە ، له شەعبيەوە ، له مسروقەوە ، وتى : عبدالله وتى : بۆ لوت خوێن بايى هەيە (١٠٠ وشتر) ، بۆ ١٠ پەنجەكان ، ١٠ وشتر بۆ هەر پەنجەيەك[٥٢].

(٥٠) الموطأ لإمام المالك بن أنس (٥٣٠-ريواية يحيي/ ٢٢٦ ريواية أبي مصعب الزهري) أول كتاب العقل.

(٥١) مصنف عبدالرزاق ١٧٤٥٨.

(٥٢) مصنف عبدالرزاق ٦٧٩٤ ، مصنف ابن ابي شيبة ٢٧٣٦٦.



## كۆتاى مسائل